(رضي الله عنه)

# مەرجەکانی ئیمامی عومەر و سنووری پێکەوە ژیانی ئاشتیانە لە ئیسلامدا

ئامادەکردنی: فواد تەوحیدی



الحمد لله الذي أمر بالجهاد في سبيله، ووعد عليه الأجر العظيم والنصر المبين، وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له القائل في كتابه الكريم: (وَكَانَ حَقًّا عَلَيْنَا نَصْرُ الْمُؤْمِنِينَ)[الروم:٤٧] وأشهد أن محمدا عبده ورسوله وخليله أفضل المجاهدين وأصدق المناضلين وأنصح العباد أجمعين ﷺ وعلى آله الطيبين الطاهرين، وعلى أصحابه الكرام الذين باعوا أنفسهم لله وجاهدوا في سبيله حتى أظهر الله بهم الدين وأعز بهم المؤمنين، وأذل بهم الكافرين رضي الله عنهم وأكرم مثواهم وجعلنا من أتباعهم بإحسان إلى يوم الدين.

كاتێك لە لایەن عەلمانیەكانەوە دەوترێت پێكەوە ژیانی ئاشتیانە. وا تێدەگەین كە لە ئیسلامدا ڕێگە دراوە هەر كەسەو چۆنی ویست ئاوها بژی.

ئەو شێوە خواپەرستییە بكات كە خۆی دەیەوێت.

ئەو ڕێبازە بگرێت كە پێی خۆشە, چۆنی ویست وا بجوڵێتەوە, بانگەواز بۆ هەر بیردۆزەو ڕێبازێك بكات كە دەیەوێت, وا تێگەیەنراوین كابرای كافر بۆی هەیە بە هەر شێوازێك پێی خۆش بوو بانگەشە بۆ بیرەكەی بكات و مێشك و هۆشی خەڵكی بشواتەوە, ڕەخنە لە هەموو شتێك بگرێت ئەگەر چی ڕەخنەو بێ ئەدەبیش بوو بەرامبەر بە سنوورە سوورەكانی دین, بە پاساوی كرانەوەو مەدەنییەت و ئازادی چۆنی ویست بێ ڕەوشتی

بڵاوبكاتەوە و ئەمەش ناو دەنێن بە ئازادی ڕادەربڕین و ئازادی تاكە كەسی و ڕۆژانامەگەری.

ئەم پێكەوە ژیانە لە دەوڵەتە بە ناو دیموكراسی و دیموكراتییەكانیشدا بۆ موسڵمان بە ڕەوا نەبینراوە... ئیتر نازانم بە چ دەقێك ئەمە پشت ڕاست دەكەنەوەو چی دەكەنە بەڵگە بۆ ئەم بانگەشە باتیلە؟

بەڵێ ڕێگە دراوە كەسی ئەهلی كیتاب لە دەوڵەتی ئیسلامیدا بژی..

مافی خۆشی دەدرێتێ بە شێوەیەك كەس بۆی نییە بە بێ هۆ ستەمی لێ بكات و ئازاری بدات, لە زۆر شت دەبەخشرێت, نوێژو ڕۆژو و واجباتەكانی لەسەر نییە, زەكات نادات, بەرگری ناكات لە سنوری دەوڵەت و جیهادی لەسەر نییە, تەنها لە بری هەموو ئەمانەدا جیزیە دەدات, بەڵام لە بەرامبەردا مافی لەسەر شانە, ئەو دینە بەتاڵەی هەڵی بژاردووە ئازادە بۆ خۆی پیادەی بكات, بەڵام بەو مەرجەی نەبێتە ئازارو بار بەسەر موسڵمانانەوە, بە بەرچاوی ئەوانەوە شتێك نەكات كە لای ئەمان مونكەرەو واجبە بگۆڕدرێت و لێی بێ دەنگ نەبیت..

بۆی هەیە حەرام بخوات بەڵام بۆی نییە بانگەشەی بۆ بكات...

من درێژە نادەم بە ووردەكاری ئەمە, ئەچینە خزمەت مێژووی پڕ لە سەروەری ئیسلام, ئەچین بۆ لای ئەو مەرجانەی ئەهلی زیمە خۆیان لەسەر خۆیلان داناوەو ئیمامی عومەر ﷺ سەرپەرشتی كردووە,

هەرچەندە زۆر بە داخەوە ئەم بابەتە بە تەواوی نامۆ و شاراوەیە لە لای زۆرێکمان, کە ئەمە نەك لەسەردەمی خەلیفە عومەردا ﷺ بەڵکو کارپێکراو بووە لە زۆربەی سەردەمەکاندا.

بە شێوەیەك ابن القیم(ڕەحمەتی خوای لێ بێت) فەرمویەتی: (وشهرة هذه الشروط تغني عن إسنادها فإن الأئمة تلقوها بالقبول وذكروها في كتبهم واحتجوا بها ولم يزل ذكر الشروط العمرية على ألسنتهم وفي كتبهم وقد أنفذها بعده الخلفاء وعملوا بموجبها) أحكام أهل الذمة (٣/ ١١٦٤-١١٦٥).

واتە: مەشهوری ئەم مەرجانە زۆر لەوە بڵاوترە کە ئیسنادەکانی بهێنینەوە چونکە پێشەوایان بە جوانی وەریان گرتوەو لە کتێبەکانیاندا باسیان کردووەو بە بەڵگە هێناویانەتەوە, وە بە بەردەوامی مەرجەکانی عومەر ﷺ لەسەر زمان و کتێبەکانیان بووە و خەلیفەکانی دوای ئیمامی عومەر ﷺ خۆیشی کاریان بە بەندەکانی کردووە.

مەرجە کانی ئیمامی عومەر ﷺ بۆ ئەوانەی لە ژێر سایەی دەوڵەتی ئیسلامیدا دەژین:

(قال عبدالله بن الإمام أحمد حدثني أبو شرحبيل الحمصي عيسى بن خالد قال حدثني عمي أبو اليمان وأبو المغيرة قالا أخبرنا إسماعيل بن عياش قال حدثنا غير واحد من أهل العلم قالوا: (كتب أهل الجزيرة إلى عبدالرحمن بن غنم: إنا حين قدمت بلادنا طلبنا إليك الأمان لأنفسنا وأهل ملتنا على أنا شرطنا لك على أنفسنا ألا: نحدث في مدينتنا كنيسة ولا فيما حولها ديرا ولا قلاية ولا صومعة راهب, ولا نجدد ما خرب من كنائسنا ولا ما كان منها في خطط المسلمين وألا نمنع كنائسنا من المسلمين أن ينزلوها في الليل والنهار وأن نوسع أبوابها للمارة وابن السبيل ولا نؤوي فيها ولا في منازلنا جاسوسا وألا نكتم غشا للمسلمين وألا نضرب بنواقيسنا إلا ضربا خفيا في جوف كنائسنا ولا نظهر عليها صليبا ولا ترفع أصواتنا في الصلاة ولا القراءة في كنائسنا فيما يحضره المسلمون وألا نخرج صليبا ولا كتابا في سوق المسلمين وألا نخرج باعوثا قال والباعوث يجتمعون كما يخرج المسلمون يوم الأضحى والفطر ولا شعانين ولا نرفع أصواتنا مع موتانا ولا نظهر النيران معهم في أسواق المسلمين وألا نجاورهم بالخنازير ولا ببيع الخمور ولا نظهر شركا ولا نرغب في ديننا ولا ندعو إليه أحدا ولا نتخذ شيئا من الرقيق الذي جرت

عليه سهام المسلمين وألا نمنع أحدا من أقربائنا أرادوا الدخول في الإسلام وأن نلزم زينا حيثما كنا وألا نتشبه بالمسلمين في لبس قلنسوة ولا عمامة ولا نعلين ولا فرق شعر ولا في مراكبهم ولا نتكلم بكلامهم ولا نكتني بكناهم وأن نجز مقادم رؤوسنا ولا نفرق نواصينا ونشد الزنانير على أوساطنا ولا ننقش خواتمنا بالعربية ولا نركب السروج ولا نتخذ شيئا من السلاح ولا نحمله ولا نتقلد السيوف وأن نوقر المسلمين في مجالسهم ونرشدهم الطريق ونقوم لهم عن المجالس إن أرادوا الجلوس ولا نطلع عليهم في منازلهم ولا نعلم أولادنا القرآن ولا يشارك أحد منا مسلما في تجارة إلا أن يكون إلى المسلم أمر التجارة وأن نضيف كل مسلم عابر سبيل ثلاثة أيام ونطعمه من أوسط ما نجد ضمنا لك ذلك على أنفسنا وذرارينا وأزواجنا ومساكيننا وإن نحن غيرنا أو خالفنا عما شرطنا على أنفسنا وقبلنا الأمان عليه فلا ذمة لنا وقد حل لك منا ما يحل لأهل المعاندة والشقاق فكتب بذلك عبدالرحمن بن غنم إلى عمر بن الخطاب رضي الله عنه فكتب إليه عمر أن أمض لهم ما سألوا وألحق فيهم حرفين أشترطهما عليهم مع ما شرطوا على أنفسهم ألا يشتروا من سبايانا شيئا ومن ضرب مسلما عمدا فقد خلع عهده, فأنفذ عبدالرحمن بن غنم ذلك وأقر من أقام من الروم في مدائن الشام على هذا الشرط قال الخلال في كتاب أحكام أهل الملل أخبرنا عبدالله بن أحمد فذكره)

أحكام أهل الذمة (٣/ ١١٥٩-١١٦٣

واتە: ئەهلی جزیرە نامەیەکیان نوسی بۆ عبدالرحمن ی کوڕی غنم ﵁ کە: کاتێ تۆ هاتویتە شارەکەمان داوای ئەمانت لێ دەکەین بۆ خۆمان و ئەهلی میللەتەکەمان لە بەرامبەردا کۆمەڵێك مەرجمان لەسەر خۆمان داناوە کە خۆمان لە کۆمەڵێك سنوری سوور بەزاندن دوور بخەینەوە بەوەی:

لە شارەکەمان و چواردەوریدا هیچ دێر و کەنیسەو قەلایەو صەومیعەیەکی ڕاهیبی تر دروست نەکەین.

تێبینی/ دێر(شوێنێکی گەورەیە گاورەکان لە دەرەوەی شار بۆ راهیبەکان دروست دەکەن تا خواپەرستی تیا بکەن) و قەلایە (شوێنێکی بەرزە جێگای یەك کەسی تیا دەبێتەوەو لە دەرەوەی شار بۆ گۆشەگیری و خواپەرستی ڕاهیبەکانیان دروست دەکرێت) و صەومیعەیەکی ڕاهیبی (بۆ یەك کەسەو لەسەر ڕێگادا دروست دەکرێت).

- وە ئەوانەشی کە کۆن بووەو کاول بووە یان لە بەشی موسڵماناندایە چاکی نەکەینەوە وە ڕێگری نەکەن لە هیچ موسڵمانێك کە بە ڕێبواری دابەزێتە ئەو کەنیسانەوە شەو بێت یان ڕۆژ.
- وەدەرگاکانی فراوان بکەین بۆ هاتوچۆکاران و ڕێبواران.

- وە نە لە كەنیسەو نە لە ماڵەكانماندا جاسوس داڵدە نەدەین.
- وە هیچ خیانەت و غەشێك نەشارینەوە لە موسڵمانان.
- وە لە ناقوس نەدەین ئیلا زۆر بە هێواشی نەبێت ئەویش تەنها لە ناو كەنیسەكانماندا.

(ناقوس: پارچە دارێكی گەورەیە جولەكە وەك زەنگێك بەكاری دێنن بە دارێكی تر پیایدا دەكێشن و بە دەنگەكەیدا دەزانن كاتی نوێژەكانیانە).

- وە هیچ خاچێك لە ناو كەنیسەكانماندا دەرنەخەین و دەنگ بەرز نەكەینەوە لە ناویدا لە نوێژ و خوێندنەكانمان كاتێك موسڵمانان ئامادە بوون.
- وە هیچ خاچ و كتێبێك نەبەینە ناو بازاڕی موسڵمانانەوە.
- وە بە شادی دەربڕینەوە دەرنەچین بۆ باعوث و شەعانین

(باعوث: چونە دەرەوەیانە بۆ دوای باران بارین كردن بە وێنەی نوێژە بە بارانەی موسڵمانان).

(شەعانین: جەژنێكی گاورەكانە دەكەوێتە ڕۆژی یەك شەممەی بەر لە جەژنی (الفصح)یان, گاورەكان تیایدا ئاهەنگ دەگێڕن بە بۆنەی یادی چوونە ژوورەوەی المسیح بۆ بیت المقدس, وە جەژنی الفصح جەژنی یادی هەستانەوەو زیندووبونەوەی المسیح ە بە بۆچۆنی خۆیانەوە).

- وە دەنگمان بەرز نەکەینەوە لە کاتی بەڕێکردنی مردووەکانماندا و ئاگر نەبەین لەگەڵی لە بازاڕی موسڵمانان‌دا.
- وە لە نزیکیانەوە بەراز ڕانەگرین و مەی نەفرۆشین و هیچ جۆرە شیریکێك دەرنەخەین و دینەکەمان نەخەینە ڕوو بۆ کەس و بانگەوازی هیچ کەسێك نەکەین بۆی و هیچ کەنیزەیەکی ئازادکراو کە بەشی موسڵمانانی تیا بێت ڕاینەگرین.
- وە ڕێگری هیچ کەسوکارو نزیکانێکمان نەکەین کاتێ ویستیان بێنە ناو ئیسلامەوەو پابەند بین بە پۆشینی پۆشاکی تایبەتی خۆمانەوە لە هەر شوێنێك بوین، تا بناسرێینەوە.
- وە خۆ نەشوبهێنین بە موسڵمانان لە لەسەر کردنی کڵاو و عەمامەو نەعل و قژ لادان و سواربونیان.
- وە بە زمان و شێوە قسە کردنی ئەوان قسە نەکەین و بە لەقەب و کونیەی ئەوان خۆ کونییە نەکەین و پێشە سەرمان ببڕین و قژمان لە نێوچاواندا دانەهێنین و قایشی زەنانیر لە پشت بکەین و لەسەر مستیلەکانمان بە عەرەبی نەقش نەکەین و سواری سروج نەبین.
- هیچ چەکێك لای خۆمان گل نەدەینەوەو هەڵی نەگرین و شمشێر لە مل نەکەین.
- ڕێز بگرین لە موسڵمانان لە مەجلیسەکانیاندا و ڕێگەیان نیشان بدەین.

- ئەگەر ویستیان دابنیشن هەستین لەبەریان و لە ماڵەكانیان نەچین بۆ لایان.
- منداڵەكانمان فێری قورئان خوێندن نەكەین.
- وە هیچ یەكێك لە ئێمە نەبێتە شەریكی بازرگانی لەگەڵ موسڵمانێكدا ئیلا موسڵمانەكە فەرمانی بازرگانییەكەی بەدەست بێت.
- وە سێ ڕۆژ میوانداری هەموو موسڵمانێكی ڕێبوار بكەین و لە مامناوەندترین خواردنمانی بدەینێ كە هەمان بێت.

ئەوا ئەم مەرجانەمان لەسەر خۆمان و نەوەكانمان و خێزانەكان و هەژارەكانمان دانا خۆ ئەگەر شتێكمان لەمانە گۆڕی یان پێچەوانەی جوڵاینەوە لەوەی لەسەر خۆمانمان داناوە لەبەرامبەر بە دەست هێنانی ئەمان ئەوا هیچ زیممەیەكمان نییەو بۆت حەڵاڵە بجوڵێیتەوە بەرامبەرمان وەك چۆن بەرامبەر ئەهلی ملنەدەرو دوژماندا دەجوڵێنەوە.

ئیتر عبدالرحمانی كوری غنم ئەمەی نارد بۆ عومەری كوری خەتاب ﵁ و ئەویش نامەیەكی بۆ ناردەوەو تیایدا نوسیبوی: لەگەڵیان بڕۆ لەو شتەدا كە داوایان كردووە بەڵام دوو ڕستەی تری بۆ زیاد بكە لەو مەرجانەی لەسەر خۆیان داناوە ئەویش:

- هیچ كەنیزەیەكمان نەكڕن.
- هەركەسێكیشیان بە ئەنقەست لە موسڵمانێكی دا ئەوا پەیمانەكەی لە ملی داماڵیوە.

ئیتر عبدالرحمن ی كوری غنم ﵁ ئەمەی ئیقرار كردو هەركەسێك لە ڕۆم دەستەڵاتی بەدەستەوە بوبێت لەسەر ئەم مەرجانە ڕۆیشتووە.

لە ریوایەتی تریدا هاتووە ئیمامی عومەر ﵁ خۆی ئەم مەرجانەی لەسەر داناون....

ئیتر دەوڵەتی ئیسلامی زۆر بە ئاسودەیی هەموو لە ژێر سایەی دادگەری شەرعی خوادا بە ئاسودەیی دەژیان.

هەر بڕگەیەك لەم خاڵانە چەندان ڕونكردنەوە هەڵدەگرێت, زەمەنی پڕ سەروەری خیلافەت ئاوا بووە, موساوەمە نەكراوە بۆ ڕازی كردنی خەڵك, سنوری شەرعی نەشێوێنراوە لەبەر سیاسەت و خۆگونجاندن, لەبەر بەرژەوەندی چەند كەسێك موداهەنە نەكراوە بە مودارات...

جا ئەگەر ئەمە سنووری ئەهلی كیتاب بوبێت لە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامیدا ئاخۆ ئێستاكە سنووری كەسانێك كە بانگەشەی خراپەو شیرك و داوێن پیسی بكەن و بە ناوی ئازادییەوە عەقیدەو ڕەوشتی میللەت بخەنە مەترسییەوەو بانگەشەی جیاكردنەوەی دین بكەن لە ژیان و ئیسلام و....شەعائیرەكانی بەكۆنەپەرستی و دواكەوتوویی و نەگونجاو تۆمەتبار بكەن... ئەبێت سنوریان چی بێت؟!!..

ئەوەیان بۆ خوێنەر بەجێ دێڵم كە بە دواداچوونی بۆ بكات.

وسبحانك اللهم وبحمدك، أشهد ألا إله إلا أنت ،أستغفرك وأتوب إليك، وصلَّى الله وسلَّم على نبينا محمد وعلى آله وصحبه وسلم أجمعين ، والحمد لله رب العالمين،،،